# حوکمی کۆکردنەوەی دوو نوێژی فەرز بەهۆی باران بارین

دانراوی: مامۆستا مەلا تەیب بەحرکەیی
وەرگێڕانی: محمد مەلا طاهیر بەحرکەیی

بەناوی خوای گەورە و میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە زانایانی کردووەتە میراتگری پێغەمبەران، وەفێری بڕیارە شەرعیەکانی کردوونە چ حەلال چ حەرام، وەفەرمانی پێ کردینە بە بڵاوکردنەوەی ئەو فەرمانانە لۆ خەڵکان، بارانی ڕەحمەت دارژێتە سەر ئەو کەسەی کە هەڵساوە بە بڵاوکردنەوەی نور ورۆشنایی وشەریعەتی پیرۆزی ئیسلام محمد (سەلام و ڕەحمەتی خوای لەسەر بی) لەسەر خۆی و کەسوکاری و هاوەڵانی وە ئەو کەسانەی شوێنی دەکەون تا ڕۆژی دوایی.

لەپاشان: زۆر جاران هەستمان بەوەی کردیە کەوا بەشێکی زۆر لەو پێشنوێژانەی پێشنوێژی لۆ خەلک دەکەن لە پارێزگا جیا جیاکانی کوردستانە ئازیزەکەمان هەڵدەستن بە کۆکردنەوەی (جمع)ی دوو نوێژ یان زیاتر بەهۆی باران بارینی وەرزی، وە ئێمە پێمان وایە کە بەشێک لەو شوێنانە، وە هەندێک کات، وە هەندێک جۆری باران بارین ناگونجێ بکرێ بەهۆیەک لۆ ئەو ئاسانکاریە (ڕوخسەتە) شەرعیە، وەزۆر لەو نوێژکەرانە ئەو مەرجانەیان تێدا نیە کەوا گەورە زانایانی پێشینە دایان ناوە لۆ دروستی ئەو کۆکردنەوەیە.

لەبەر ئەوە بڕیاماندا بە لێکۆڵینەوەو گەڕان لە حوکمی کۆکردنەوەی ئەو نوێژەی کە باسمان کرد لە چاکترین ئەو کتێبانەی کەوا تایبەتن بە فەرموودەی حەزرەت ﷺ، وە لە کتێبەکانی فیقهی

بەراودكاری، وە لە پاش لێكۆڵینەوەو گەڕان لەو بابەتەی بە ئیزنی خوای گەورە هەستاین بەنوسینەوەو پێشكەش كردنی بە خوێنەرە خۆشەویستەكان، وە داوا دەكەم لە پێشنوێژەكان وئەوانەش كە نوێژیان لە دوا ئەنجام دەدەن بە جێبەجێ كردنی ئەو بڕیارانەی كەوا لەم لێكۆڵینەوە شەرعیەدا بە ئاشكرایی ڕۆن كراوەتەوە.

وە ئەو برایانە با بزانن ئەو بابەتە پەیوەندی بە بەرژەوەندی كەسێكەوە یان ئامانجێكی سیاسیەوە نیە، بەڵكو ئەوە بڕیارێكی شەرعیە ومەبەست پێی هیچ كەسێك نیە، حەزرەت ﷺ دەفەرموێ: ((الدین النصیحة))[١]، واتە: (دین ئامۆژگاریە)، هەروەكو چۆن خۆشەویستمان و پێشەوامان فێری كردینە، خوای گەورە بەگەورەیی و بەخششی خۆی ڕێمان پیشان بدا لۆ هەرچی كاری چاكەیە.

زانایە گەورەكان وشوێنكەوتوانیان ڕای جیاوازیان هەیە لەم مەسەلەیە، لەلایەن ئیمامی شافیعیەوە دروستە (جمع) كۆكردنەوەی نوێژی نیوڕان وعەسر، یان نوێژی مەغریب وعیشا، بەڵام بە پێشخستن (تقدیم) نەك پاشخستن (تأخیر)، بەڵگەشیان لۆ ئەو حوكمە ئەو فەرموودەیەیە كە ئیمامی بوخاری بەسەنەدی خۆی گێڕایتیەوە لە جابری كوڕی زەید ناسراو بە (أبو الشعثاء)، ئەویش لە (ابن عباس) درودی خوایان لەسەربێ: ((أن النبي ﷺ صلى بالمدينة سبعا وثمانيا، الظهر والعصر، والمغرب مع العشاء، فقال أيوب: لعله في ليلة مطيرة، قال أبو الشعثاء: عسى))[٢].

واتە: حەزرەت ﷺ حەفت نوێژی پێكەوە كرد، وە هەشت نوێژیشی پێكەوە كرد، نوێژی نیوڕان و عەسرێ، وە نوێژێ مەغریب و عیشا، ئەیوب فەرموی: لەوانەیە ئەوە لەشەوێك بووبێ باراناوی بوبێ، أبو الشعثاء فەرموی: ڕەنگە قسەكەت وابێ، وەبەڵگەی ئەو فەرموودەیەی كە ئیمامی موسلیم بەسەنەدی خۆی ڕیوایەتی كردیە لە

(ابن عباس) ڕەزایان خوایان لەسەر بی، (صلى ﷺ الظهر والعصر جميعا، والمغرب والعشاء جميعا، من غير خوف ولا سفر)[٣].

واتە: حەزرەت ﷺ نوێژی نیوڕان و عەسری پێکەوە کرد، وە نوێژی مەغریب وعیشای پێکەوە کرد، بێ ئەوەی هۆیەکەی ترس بێ یان لەسەفەر دا بووبێ.

ئەو دوو فەرموودەیە هەروەک دیارە لە هیچ شوێنێک لە دەقی فەرموودەکان ئاماژە بەوەی نەکرایە کەوا دروستە کۆکردنەوەی نوێژەکان بەهۆی باران بارین، بەڵام ئیمامی مالیک وأبو الشعثاء ئیجتیهادیان کردیە لۆ تەفسیری ئەم فەرموودەیەو بڕیاردان لەسەری، ئیمامی مالیک دەفەرموێ: (أرى ذلك في المطر)[٤]، واتە: وای لۆ دەچم هۆیەکەی باران بارین بێت.

هەروەها أبو الشعثاء دەفەرموێ (عسى)، واتە: لەوانەیە هۆی کۆکردنەوەی ئەو نوێژانەی حەزرەت ﷺ باران بارین بێت، بەهۆی ئەوەی ئەو شەوە، شەوێکی باراناوی بووە، ئیمامی شافیعیش هەمان بۆچوونی هەیە، بەڵام بەشێک لەگەورە زانایان وەڵامی ئەو دوو بەڵگانەیان داوەتەوە بە گێڕانەوەیەکی دیکە کە هەمان ئەو فەرموودەیەیە بەڵام بە ڕیوایەتەکی دیکە، ئەویش ئەو فەرموودەیەیە کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردیە لە صەحیحەکەی خۆی، وە ئیمامی ئەبو داودیش لە سونەنی خۆی، هەر دووکیان بەسەنەدی خۆیان تاوەکو دەگاتە ابن عباس (خوای گەورە لێی ڕازی بی)، قال: (جمع رسول الله ﷺ بالمدينة من غير خوف ولا مطر)[٥].

واتە: حەزرەت ﷺ کەلەمەدینە بوو، دوو نوێژی کۆکردەوە بێ ئەوەی هۆیەکەی ترس بێ، یان باران بارین بێ).

ئەو ڕیوایەتەی دووەم کە باسمان کرد لە گێڕانەوەی(حەبیبی کوڕی أبی ثابیتە) ئەویش یەکێکە لە ئیمامە گەورەکان، زانایان یەک دەنگن لەسەر گەورەیی وڕاستگۆیی وعەدالەتی ولێ قەبوڵکردنی

فەرموودە، ئەو مەرجانەشی هەموو تێدایە کە ئیمامی بوخاری دایناوە لۆ قبوڵ کردنی فەرموودە، بەڵام دوو فەرموودەکە پێچەوانەی یەکترن، هەر لەبەر ئەم هۆیەیە بەشێک لە گەورە زانایان هەوڵیان داوە لۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەو چەند لێکدانەوەیەکیان کردیە، یەکەک لەو لێکدانەوانە ئەوەیە (حەزرەت ﷺ نوێژەکانی کە کۆکردوەتەوە (جمع) هۆیەکەی نەخۆشی بووە)، ئیمامی نەوەوی ئەم لێکدانەوەیەی زۆر پێ باشە لەشەرحی سەحیحی ئیمامی موسلیم[٦].

هەروەها لە پێش ئیمامی موسلیم ئیمامی ئەحمەد و قازی حسین و خطابی و چەندین زانای تریش هەمان ڕایان هەیە.

یەکێکی دیکە لەو لێکدانەوانە ئەوەیە (حەزرەت ﷺ نوێژەکانی لە کاتی خۆی کردیە تەنیا شێوەکەی بە لێکدان (جمع) دەچی، واتە: حەزرەت ﷺ نوێژی نیوڕانێی بەدرەنگەوە کردیە بەو مەعنایەی نوێژەکەی کردیە پێش ئەوەی بانگی عەسرێ بدا، وە نوێژی عەسریشی لە سەرەتای کاتي خۆی کردیە، واتە: هەر بانگی دایەو نوێژی عەسری کردیە، وە نوێژی مەغریب و عیشاشی بەهەمان شێوە کردیە)، واتە حەزرەت نوێژەکانی کۆنەکردۆتەوە بەو مەعنایەی کە ئێمە باسی دەکەین، ئیمامی ئیبن حەجەری عەسقەلانی ئەو لێکدانەوەی پەسند کردووە، بڕوانە فتح الباری[٧].

لەپێش ئیمامی ئیبن حەجەر ئیمامی حەڕەمەین وئیمامی قورطوبی وئیمامی طەحاویش هەروایان فەرمووە، بەڵگەشیان ئەوەیە: (أبو الشعثاء) کە ئەو فەرموودەیەی گێڕاوەتەوە، هەر خۆی لە گێڕانەوەیەکی تردا کە پێشەوا بوخاری تەخریجی کردووە ئەویش هەمان ئەو لێکدانەوی کردووە، ئیمامی بوخاری تەخریجی کردووە بەسەنەدی خۆی لە (عەمر) دەفەرموێ لە (ابو الشعثاء)م بیستووە ئەویش لە (ابن عباس) ڕەزای خوای لەسەربێ، ئەویش لەپێغەمبەری ﷺ بیستووە، قال: ((صليت مع رسول الله ﷺ ثمانيا

جميعا وسبعا جميعا))، قال عمرو: قلت يا أبا الشعثاء أظنه أخّر الظهر وعجّل العصر. وعجّل العشاء وأخّر المغرب، قال: وأنا أظنه[٨].

واته: نوێژم لەگەل حەزرەت ﷺ كرد دوو نوێژ پێكەوە حەفت ركات، دوو نوێژیش پێكەوە هەشت ڕكات، عەمر بە أبو الشعثائی فەرموو: وای لۆ دەچم حەزرەت ﷺ نوێژی نیوڕانێی درەنگ كردبی ونوێژی عەسریشی زوو كردبی، وە نوێژی مەغریبی درەنگ كردبی و نوێژی عیشاشی زوو كردبی، أبو الشعثاء فەرمووی: منیش پێم وایە.

كەواتە ئیستیدلالی زانایان لۆ ئەو فەرموودەیەی باسمان كرد كە دەلیل بی لەسەر كۆكردنەوەی دوو نوێژ، بەڵگەیەكی بێ هێزە، وە زانایان باسی ئەوەیان نەكردیە كە حەزرەت ﷺ فەرموودەیەكی هەبێ یان كارێكی كردبێ بكرێتە بەڵگە لۆ دروستی كۆكردنەوەی دوو نوێژ بێجگە لەو فەرموودەیەی باسمان كرد، لەبەر ئەم هۆیە زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر حوكمی ئەو كۆكردنەوەیە (جمع)ـە، ئیمامی گەورە ئەبو حەنیفە وهاوەڵەكانی وئیمامی موزەنی قوتابی ئیمامی شافیعی فەرموویانە: درووست نیە دوو نوێژ كۆبكرێتەوە لە هیچ كات بە تایبەت كۆكردنەوە بە هۆی باران بارین! چونكە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ((إن الصلاة كانت على المؤمنين كتابا موقوتا))[٩].

ئەو ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە هەر نوێژەك كاتەكی تایبەت و دیاریكراوی خۆی هەیە، دروست نیە دوو نوێژ لەیەك وەختی بكرێ، بەڵگەیان بەفەرموودەش هەمان ئەو فەرموودە ڕاست و موتەواتیرانەیە كە لە باشترین و چاكترین كتێبانی فەرموودە هەیە.

وەئەو فەرموودەیەی پێشتر كە كراوە بەبەڵگە لۆ دروستی كۆكردنەوەی دوو نوێژ بەهۆی باران بارین فەرموودەیەكی (ئاڵۆز ـ

مضطرب)ـە، بەچەند ڕیوایەتی پێچەوانەی یەکتری گێڕدراێتەوە، وە بەچەند شێواز و ووشەی جودا، وە بەچەند لێکدانەوەی پێچەوانەی یەکتر، دەبینی ڕاوی فەرموودەکە کە ناوی (ابو الشعثاء)ە کۆکردنەوەی ئەو نوێژانە بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە بەهۆی باران بارین بووە، بەڵام جارێکی تر لەفەرموودەیەکی دیکەدا هۆیەکەی لۆ (کۆکردنەوەی شکلی – الجمع الصوري) دەگێڕێتەوە هەروەک زانرا، لەگەل هەموو ئەوانەش ئەو فەرموودەیە دەقێکی ئاشکراو دیاری نیە لەو بابەتەی ئێمە مەبەستمانە، کەواتە ناکرێ ئەو فەرموودەیە بکرێتە بەڵگە، کەواتە ئەم فەرموودەیە نە تەخصیصی ئەو ئایەتە دەکا کە دەقێکی قطعیە، ونە تەخصیصی فەرموودە موتەواتیرەکانیش دەکا، لەبەر ئەم هۆیە ئیمامی مالیک فەرموویەتی: دروست نیە کۆکردنەوەی نوێژی نیوڕان و عەسر، بەڵام دروستە کۆکردنەوەی نوێژی مەغریب و عیشا، ئیمامی ئەحمەد وقوتابییەکانی هەمان ڕایان پێ باشە، وە هەر لەبەر ئەم هۆیەیە ئیمامی شافیعی و قوتابیەکانی فەرموویانە: کۆکردنەوەی دوو نوێژ بەهۆی باران بارین دروستە بەڵام پێشخستن واتە دوو نوێژەکە کۆبکرێتەوە وبەپێشی بخەی (جمع التقديم) نەک دوای بخەی (جمع التأخير).

ئەو ڕاجیاییەی لەنێوان زانایاندا هەیە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی دەقێکی ئاشکرا لەسەر ڕۆنکردنەوەی حوکمی کۆکردنەوەی دوو نوێژ بەهۆی باران بارین، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ تێگەیشتن وئیجتیهادی زانایان.

وە پێویستە ئەوەش برزانین لە سەردەمانی پێشتر باران زۆر بەخوڕ دەباری، وە زۆر جاران بەفر لەسەر یەک دەکەت، ڕێگا وبان باش نەبوو، خەڵکان لێ گیر دەبوون، ئاو دەیبەستی، هۆیەکانی گەرم کردنەوە کەم بوو، تەنانەت مزگەوتی حەزرەت ﷺ بانی هەر نەبوو، جار هەبوو حەزرەت ﷺ لەپاش باران بارینێ نوێژی دەکرد کە دەچووە سەجدە نیوچەوانی شەریفی بەقوڕ دەبوو، ئەو هۆیانەی

که باسمان کرد هەمووی هۆکارە لۆ ئەوەی ئاسانکاری بکرێ لۆ بەجێ گەیاندنی نوێژەکان و کۆکردنەوەی لەهەندەک کاتی تایبەتدا، وەهەمان ئەو حوکمە هەندێ کەس دەگرێتەوە لەسەردەمی ئێستاماندا، بەتایبەت ئەوانەی لە گوندەکانی ناوچە شاخاویەکان دەژین، کە شەوی تاریکە وخەڵک بە زەحمەت دەیگەنێ و بەشەوان بەفرو شرێوەی لێ دەباری و بەردەوام بای ساردی لێ هەڵ دەکا، وە دۆڵ ونشێو دەکەوێتە نێوان مزگەوت وماڵیان، بەڵام ئێستا ئێمە لەکوردستانە خۆشەویستەکەمان وپارێزگا جیاجیاکان وئەو گوندانەی دەوروبەریان هەمووی ئاوەدانن، ڕێگا وبانیان هەیە وکارەبایان هەیە وبەردەوام ڕۆناکن و زۆری دیکە لەو بەخششانەی کە نایەتە ژماردن، ئەوە بێگومان سوپاسی خوای گەورەی دەوێ، وپێویستە لەسەرمان لەبەرامبەر ئەو هەموو بەخششە خوداییانە بەردەوام گرنگی بە نوێژەکانمان بدەین، نەوەک ڕوو بکەینە ڕوخسەتەکی نادروست، ئەو کۆکردنەوەیە خوای گەورە دای نایە لۆ نەهێشتنی بارگرانی وقورسایی لەسەر بەندەکان، وەئەگەر ئەو بارگرانی وقورساییە نەما ئەو ئاسانکاریەش نامێنێ، چونکە نەمانی هۆ (علة) دەبێتە هۆکاری نەمانی ئەو حوکمەی کە پێیەوە بەندە، هەروەک لە زانستی (أصول الفقه) دا باس کراوە.

بێجگە لەوەی باسمان کرد ئەو زانایانەی کەوا ڕێگەیان بە جەمع کردنی نوێژ دایە بەهۆی باران بارین چەند مەرجی دیکەشیان داناوە لەگەل ئەو مەرجانەی کەوا پێویستە هەبێت بۆ جمع کردنی نوێژ لەسەفەردا، هەندەک لەو مەرجانە ئەمانەن:

دەبێ لەکاتی نوێژی یەکەم باران بباریێ، وە دەبێ لە کاتی سەلامدانەوەی نوێژی یەکەم بارانەکە بەخوڕ بێ، وەدەبێ نوێژەکان بەجەماعەت بێ، لەمزگەوت بێ، ماڵی نوێژکەرەکە لەمزگەوت دوور بێ، بە زەحمەت بگاتە مزگەوتێ وزەحمەتیەکەش بە شێوەیەک بێ کە لەتوانای دا نەبێ وبەرگەی نەگرێ، بەڵام ئەو

کەسەی کە دەتوانێ بچیتە مزگەوت لەڕێگایەکی کورت یان ئاسان یان لە سوچەک یان لەشوێنەک خۆی بپارێزێ، یان مزگەوتەکە لەوی نێزیک بی، یان تڕومبێلەک هەبوو بیگەینیتە جێ و بەبێ زەحمەتی، وە ڕێیەکەش خۆش وڕۆناک بوو، سەلامەت بوو، ئەو وەقتە دروست نیە لۆی جەمعی نوێژەکان بکا.

ئینجا بزانە، ناگۆترێ کە ماڵی حەزرەت ﷺ نێزیک بووە ولەتەنیشت مزگەفتێ بووە، لەبەر ئەوەی حەزرەت ﷺ ماڵێکی دیکەشی هەبووە لە (عالیە - شوێنەکە دەکەوتە نێوان نەجد و تیهامە) کە دایکی ئیمانداران (ماریەی قیبطیە) دایکی (ئیبراهیم)ی تێدا نیشتەجێ بووە، وە دووری نێوان هەندەک لەو شوێنانەی کە دەکەونە پشت (عالیە)و نێوان مزگەوتی حەزرەت ﷺ چوار میل بووە، وە حەزرەت ﷺ چەند ماڵی دیکەشی هەبووە کە دووربووینە لە مزگەوت، ئەو ماڵەی کە لەهەمووویان نێزیکتر بوو ماڵی حەزرەتی (عائیشە) بوو (ڕەزای خوای لەسەربی)، وەئەگەر بەدەرکەوت کە حەزرەت ﷺ نوێژی کۆکردوەتەوە لەبەر باران بارین ئەوا ڕەنگە لەیەکەک لەو ماڵە دوورانە بووبێت.

لەپاش ئەوەی زانرا کە حوکمی کۆکردنەوەی نوێژ لەکاتی باران بارین حوکمەکی ئیجتیهادیە وهیچ دەقێکی ئاشکرای لەسەر نیە، نە لەقورئان ونە لەفەرموودەدا کە چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەو کۆکردنەوەیە لۆمان دیاربکا، پێویستە لەسەرمان ئەو ڕێیە بگرین کە زانایان لەسەری ڕۆیشتینە لە دیاریکردنی ئەو نوێژە جەمعانە، چ (تقدیم) یان (تأخیر)، چ بەشەو یان بەڕۆژ، وە ئەو مەرجانەی دایان ناوە بۆ نجامدانی ئەو نوێژە بە شێوەیەکی ڕاست و درووست.

پاشان با خۆشەویستان بزانن کە نوێژ کۆلەگەی ئاینی ئیسلامە، وە گرینگترین خواپەرستی جەستەییە، وەکو بڕبڕەی پشت وایە لۆ خوداپەرستیەکانی دیکە، وە هەر ئەو نوێژەیە خەڵک لە خراپەو

ستەم دەپارێزێ، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر هەموو ئوممەتی خۆشەویست ﷺ ئاگاداری نوێژەکانیان بن بە باشترین چاوەدێری، وە نەیخەنە سەر لێوی کەنداری فەوتان، وە ئەنجام دانی نوێژەکان لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا (وەرەع) و(تەقوا)ی تێدایەو دوورکەوتنەوەیە لە هەڵوەشانەوەی، وە دورکەوتنەوەیە لە خیلافی گەورە زانایانی پێشین، بۆیە ئەی نوێژخوێنی خۆشەویست ئەگەر هاتوو دوو نوێژت کۆکردەوە بەهۆی باران بارین ئەوا نوێژەکەت دەکەوێتە بەر قاشۆی گەورە زانایانی پێشوو، وە زۆربەیان بڕیاریان داوە بەوەی کە نوێژە کۆکراوەکەت دروست نیە هەروەک زانیت، ئەوە لەکاتەک ئەگەر ئەو مەرجانەی باسمان کرد هەمووت جێ بەجێ کردبوو، وە ئەگەر ئەو مەرجانەشت جێبەجێ نەکردبوو ئەوا بزانە بە کۆکردنەوەی ئەو نوێژانە پێچەوانەی بڕیاری کۆمەڵی زانایانی ئوممەتی موحەممەد ﷺ ڕەفتارت کردووە، هەروەکو زانراویشە کە شکاندنی ئیجماعی مسوڵمانان حەرامە، وەیەکە لەگوناحە گەورەکان، ئەو خراپیانەی باسمان کرد هەمووی ڕووت تێ دەکات ئەگەر هاتوو ئەو نوێژانە کۆبکەیەوە، بەڵام ئەگەر نوێژەکان کۆنەکەیەوە وهەموویان لە کاتی دیاریکراوی خۆی بکەی، ئەوە گەورە زانایانی ئیسلام و شوێنکەوتوانیان هەموویان یەکدەنگن لەسەر درووستی نوێژەکەت لە ڕووی کاتەوە، وە پاراستنی خیلافیش کاریکی زۆر زۆر باشە، حەزرەت ﷺفەرموویەتی: (دع ما یریبك الی ما لا یربك)[١٠].

واتە: وازبێنە لەو شتانەی کەوا گومانت لە حەلاڵی وحەرامی هەیە، بەڵکو ڕوو بکە ئەو شتانەی کەوا گومانت لێی نیە[١١].

وەکۆتا داواکاریمان سوپاس و ستایشی خوای گەورەیە.

(١) ئیمامی موسلیم تەخریجی کردووە، سەحیحی موسلم بەشەرحی ئیمامی نەوەوی: ٣٧/٢.

(٢) ئیمامی بوخاری تەخریجی کردووە لەسەحیحەکەیدا: ٢٠٥/٣، ژمارە: ٥٤٣ له فتح الباري.

(٣) ئیمامی موسلیم تەخریجی کردووە لەسەحیحەکەیدا: ٢١٥/٥ بەشەرحی ئیمامی نەوەوی.

(٤) بڕوانە (موطأ)ی ئیمامی مالیک بەشەرحی زەڕقانی: ٧/٢.

(٥) بڕوانە سەحیحی ئیمامی موسلیم: ٢١٦/٥ بەشەرحی ئیمامی نەوەوی، وە سونەنی ئەبو داود، ژمارە: ١٢١١.

(٦) بڕوانە سەحیحی ئیمامی موسلیم بەشەرحی ئیمامی نەوەوی: ٢١٥/٥.

(٧) بڕوانە فتح الباری، ئیبن حەجەری عەسقەلانی: ٢٠٦/٣.

(٨) بڕوانە سەحیحی بوخاری: ٦٢/٦، ژمارە: ١١٧٤.

(٩) سوڕەتی النساء، ئایەتی: ١٠٣.

(١٠) ئیمامی الترمذی تەخریجی کردووە، جامع الترمذي، لەگەڵ شەرحی تحفة الأحوذي: ٣٢٢/٣، ژمارە: ٢٥٢٣، وەنەسائی له المجتبى، ژمارە: ٥٧٢٧، وە ئیمام ئەحمەد، الفتح الرباني شرح مسند الامام أحمد بن حنبل الشيباني: ٧٣/٩.

(١١) بڕوانە موسنەدی ئیمام ئەحمەد لەگەل شەرحی بلوغ الأماني: ١٣١/٥، وبداية المجتهدی ئیبن ڕوشد: ٣٠٨/١، وە مەجموعی ئیمامی نەوەوی: ٢٦٣/٤، وە موغنی ئیبنو قودامەی مەقدیسی: ٥٨/٢، وە الشرح الكبيرى دەردیری مالیکی: ٣٧٠/١، وەتحفة المحتاجی ئیبن حەجەری هەیتەمی: ٤٠٢/٢، وەفتح العزيزی ئیمامی ڕافیعی، وە شەرحی وەجیزی ئیمامی غەزالی: ٢٤٤/٢.